ئیسماعیل کوردە

# 1900 تێپەڕیووە

نۆڤلێت

لەبڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكریی و ئەدەبی نما
زنجیرەی(٨٠)

سەرپەرشتیكردنی پرۆژەی چاپی كتێب
ئیسماعیل كوردە، ڕێبین ڕەسوڵ

"ئەو نۆڤلێتە (١٠) ساڵ بەر لەئێستا نوسراوە"

ناوی كتێب: ١٩٠٠ تێپەڕیووە
نوسینی : ئیسماعیل كوردە
ژانر: ئەدەب/ نۆڤلێت
پیت چنین: نما
دیزایین: نما
بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ٥٠٠
چاپی یەكەم: كوردستان/ هەولێر ٢٠١٠
چاپ: چاپخانەی شەهاب

-١-

ماریانا کارلۆس

خۆزێ مارکۆس

لیۆناردۆ تۆماس

لۆڤانا ساندراما

لۆزا گارسیا

میلۆنا پازیا

پاولۆ نیکۆلا

گابرێل تالاندی

مارکۆ ژاکاریۆ

کلاودیا کۆلاما

پـایزێکی مەیلەوسـاردە، ماڵەکـەمان لـەکۆڵانێکی تەسـك و داخراودایـە، بەشـی هـەرە زۆری کاتـەکان نـسیّ بـوو، شـوێنەکەی کـەوتبووە تەنیـشت کڵـسەیەکی کـۆن، کلێـسەیەکی سـەدان سـاڵی،

کڵسەکە تەنها بۆنی راهیبەو شەرابو دەنگی تەراتیلو مۆسیقای لێدەهات. ناوی کڵێسای مەریەم بوو، مەریەمی پاکیزە. باخچەیەکی بچکۆلانەی لەدواوە هەیە، گەرچی زۆر سەوز نەبوو، وەلێ بێدەنگیەکی پێوە دیارە، پێدەچوو هەرخۆم هەستی پێبکەم، بۆیە هەمیشە لەوێ دادەنیشتم. ئێواران پاییز باسی سەربووردەکانی خۆی دەکرد، باسی ئەو گەڵایانەی کە لەباخچەدا دەمێکە بەدیاریانەوە سرپبووم، هەندێکیان زەرد، هەندێ سوور بەلقی دارەکانەوە مابوونەوە. هەندێك لەسەر زەوییەکە کەوتبوون، سەیری ئەو پاسارییانەم ئەکرد کە پاییز لەپشتی گەڵاکانەوە ماڵەکانی دابوونە بەر خۆرو چریکە چریکیان دەهات، هەمیشە ئێوارانی دردنگ دەیانچریکاند. هەستم بەسەرما دەکرد، پێموایە ئەوانیش وەك من بەدوای ماڵێکی دیکەدا بگەڕێن، پاییز باسی تەنیایی دارەکانو تەنیایی خۆیو سەفەرە دوورەکانی خۆی دەکرد پاییز دەیگوت: لە سەفەری پێش گەڕانەوەمدا بەماڵی بەفردا تێ ئەپەڕم، لەهاویندا چاوم لێیە لەباخچەکەدا تۆ خەریکی چیت؟ ئاگام لە گوڵەکانە ..بەڵام هاتنی من هاتنی وەرزی تەنیاییو هەڵوەرینە، بەشێکە لەبێ ئومێدیو بەشێکیشە لەجوانی زیندەگی.

نەدەکرا من قسە نەکەم..قسەکردنم ئەو ئێوارەیەبوو، کە لیۆناردۆ سەرەتای تەنیاییەکانی بۆ پاییزو وەرینە جوانەکانی ئەم وەرزەی بۆ "خۆزێ"ی هاوڕێی گێڕایەوە..لەو رۆژەوە تەنیام..پاییزیش

بەردەوام دەیەوێ دەفتەری یادەورییەکانی بۆ بکەمەوە..کەسێکم هەیە! تەنیا پاییز ئاگای لێمە؟! پاییز شێتانە نهێنییەکانم ئاشکرا دەکات، بەدەست خۆشم نییە جارناجارێك بۆی باسدەکەم. خۆزێ، لەورۆژەوە من بەفرم خۆشدەوێ کاتی بارینی بەفر هەست دەکەم ژیان دەیەوێت قسەم لەگەڵدا بکات. بەفر بەئاگات دێنێتەوە کە زیندەگی ماناکانی خۆی نادۆڕێنێ..بەفر پێیدەگوتین، وەرزی خۆم خۆش دەوێت..ئای خۆزێ بەفریش ئاگای لێمان هەبوو. بەڵام هەمیشە پاییز جوانتر بوو.

ئیوارەیەکی ساردەو، زورەبایەکی تەزێنەری لێدهات، گژوگیای وەریوو، گەڵای سەرزەمینی لولدراو، بە ئێوارەیەك دەچوو چاوەڕێی شتێك بووم بەخەیاڵمدا نەدەهات چی بێت. زۆر داماوو سەرگەردان بووم، چەند رۆژێك مابوو بەرەو سەفەرێکی دوور بڕۆم. دیواری ماڵەکەمان بەدیواری کڵێسەی مەریەمەوەبوو،باخچەکەشمان بەسەر حەوشەی کڵێسەکەیدا دەڕوانی، زۆرجاران لەوێوە راهیبەکانم دەدیت، بەدزیوە سەیرم دەکردن کە چۆن لەنێو کڵێسەدا دەژیان، رەبەنو راهیبەی زۆری لێبوون دەهاتنو دەچوون، هەندێ جاریش گوێم لەتراتیلەکانی ئینجیلی عیسا ئەگرت، لەوێدا دەیانخوێند. ئاوازێکی خۆشی هەبوو، چێژم لێوەردەگرت لە هەندێکیشیان دەگەیشتم. هەموو یەکشەموانێك خەڵکی "تراونا" بەرەو کڵێسەکە دەچوون، دایكو باوکیشم..ئەو رۆژە بۆنی خۆشیان لەخۆدەدا، جلەکانیان پاكوخاوێن

دەبوەوە، خۆیان دەشوت..بخوریان دادەگیرساندو مۆمیان لەگەڵ خۆیان دەبردو ئێوارانیش کە دەگەڕانەوە زۆر دڵخۆش دەبوون. منیش جارناجارێ دەچووم..ماریانا هاوڕێم زۆرجاران پێیدەگوتم: "**بۆ چەند جارێکیش بێت بابچینە کڵێسەی مەریەم**" زۆر پێی خۆش بوو بچمو لەوێ یەکتر ببینین. ئەو چاك باوەڕی بەیەسوعو بەمەریەم هەبوو. لەناخەوە خۆشیدەویستن..

لە تراونا سەیری کەنار ئاوەکانیم دەکرد، ئێوارانی زۆر جوان بوو، کە رۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو رەنگی ئاوەکانی خۆرنشینی دەکرد...

ترینگ..ترینگ..ترینگ..ترینگ دەنگی ناقۆسی کڵێسەکەش دێت..خەڵکی لەتراونا وردە وردە لەمەزراکاندا بەرەو ماڵ دەبنەوە..هەریەکەیان شتێکی بەدەستەوەیە، من هەموو ئێواران چاوەڕێبووم لۆڤانا بەوێدا بە کۆلانی بەر باخچەکاندا دەهاتەوە. ئەوان رۆژانە دەچوونە نێو مەزراو باخچەکانی دەوروبەری تراوناو ئێواران دەگەڕانەوە. من وەك خەمزەدەیەك لەکەناری ئاوەکە دادەنیشتمو لەئێوارە رادەمام..

ئای خەمزەدە..ئێوارە دنیایەکی زۆر تەنیاو بێدەنگە، زۆر حەزم لە بێدەنگیو تەنیایی بوو، تا ئەو ڕادەیەی هەستم دەکرد خۆم بوومەتە یەك پارچە تەنیایی. هەستم بە باسو خواسی نێوان ماڵئاواییەکانی خۆرو هاتنی شەو دەکرد، گوێم لەهەناسەکانی

ئاوابوون دەبوو. ئێوارە سیحرێکی سەیر سەرمەستی نەکردم، مەگەر هەر لەتراونا ئەو جوانیە ببینیت. .یان پێدەچێت من جگە لەتراونا هیچ جێگایەکی دیکەم نەدیبێ. تا درەنگانێك لەدەم ناوەکە دەماینەوە، جارناجارێك لەگەڵ لۆڤانا لەقاقای پێکەنینمان دەماندا، جارناجارێکیش لەخۆشیاندا دەگریاین. .تا تاریك دادەهات دەماینەوە، ئەو هەمیشە درەنگی بوو، منیش نەمدەزانی چی بکەم بۆیە هەرگیز درەنگم نەبوو.

هەندێکیان بەکۆڵانەکانی بەرماڵی ئێمەدا دەڕۆیشتن‌و لە بەرخۆیانەوە قسەیان دەکرد. هەندێکیان بەبەرەکەی تری شاردا کە کۆڵانە سێبەریەکانی شاربوون، کە پڕن لە کۆڵانەباخ‌و بۆن‌و بەرامی گوڵ‌و قەنەفڵ‌و مێخەك. .تێدەپەڕین.

خۆزی تۆ دەزانی سروشتێکی جوانی هەبوو، سەیرە. .هەستم دەکرد بەهەشت بێت‌و پێی نەزانین کە بەهەشت. دیمەنەکانی چەندە جوان بوون، ژیان لەوێ سادەو. .ئای کە کچ‌و کوڕی زۆریان هەبوو، هاوڕێیەتی یەکتریان دەکرد. .لەناخەوە یەکتریان خۆشدەویست. بەڵام ئەوان زۆر لەناو باخچەو مەزراکان دەگەڕان، لیۆناردۆش خووی بەماڵەوە گرتبوو. خۆزێ من ئێستا باس لەژیانی تراونا دەکەم. .ئا تۆ دەزانی؟! خۆزی "**ئەی چۆن دەزانم**. ."ئای کە گوڵەکانی جوان بوون!! ئای کە دوور لەژیانی تەنیایی ئێستامان خۆشبوو. .هەندێکجارییش دەڵێین پێدەچێ ئێمە منداڵ بووین‌و هەستمان بەتەنیایی نەدەکرد.

منداڵیمان هەمیشە پڕ بوو لەبێهەستی..کە هاتینە "ستیمۆر" خومان بە تراوانەوە گرتبوو، سەیرم دەکرد خەڵکی زۆر تەنیاترن، ژاوەژاوی شارو ئۆتۆمبیلو دوکەڵی کارخانەکان سەری کاس دەکردی..ئاسان رانەدەهاتم..تا راهاتم زۆر سەخت دەژیام، لەو شارەدا هەستت بە نائارامی دەکرد..نەمدەزانی چیە؟! وەلێ هەستم دەکرد منداڵانی شار کەمتر دەهاتنە دەرەوە..تەنیابوون، شار زۆر تەنیایی پێوە دیاربوو..منیش زۆر بێتاقەت.

ئەوکاتەی لەستیمۆر بووم..ئێواران لەسانتی خەڵکی پیاسەیان دەکرد، کوڕوکچ پیاسەی دوریان بەیەکەوە دەکرد..دەچوونە سەر ئاوو باخچەکانی ئەوێ. بیرمە پیاوە پیرەکە دەیگوت:"**دوور رۆیشتن لەئەفسانەی ژیانو بوونی ئینسانەکاندا، ئاماژەکان بەرەو سەروادەی خولقانی مرۆڤەکانی ئەبردی..دوور رۆیشتن مەودای گومانەکان کەمتر دەکاتەوە، خۆشەویستیەکانیش تەمەن درێژتر دەکات..ئەفسانەی ئینسان لە ئاینەکانیشدا ئەفسانەی دوورییە. ئەگەرچی دووری بەردەوامییەکانی نێوان ژیانو مردنمان نیشان ئەدەن. وەلێ ئینسان چەند دوورتر بڕوات رامانەکانی دورتر دەبنو خۆشەویستیەکانی بەرەو روحیانیەت دەچن. روئیای گەشترو بینینی روونتر دەبێت**".

سەیرم دەکرد ...خۆزێ ..دەزانی هیچ گرفتێکم نەبوو، ژیانی ستیمۆر خۆی وابوو نازانم چۆن وەسفی بکەم؟! چۆن بیگێڕمەوە، ئای کە وێران بووم تەنیایی لەنێوەندی شەقامو کۆڵانەکاندا، لەنێو

ژاوەژاوی شاردا رووی بەرووەوە دەنای..یان پیّدەچوو هەر مـن وابم!!
بەڵام ئەوێ شەڕێکی گەورە بوو لەگەڵ مانەوەدا.

بۆ خوێندن هاتومەتە ستیمۆر، دوای مانگێك باوکم کە خواپەرستێکی کاسبکاری ئاینینەوە ناوی " تۆماس" هەر لە تراونا دەژیاو بیری لەمردن دەکردەوە، سەیرە..هەر خەریکی ئەودنیا بوو، مەستو سەری کاس ببوو،ژیانی لا تاڵو دەیویست ئێمەش وابین، رۆژێك لە ستیمۆر هاتە لام دەمزانی کارێکی هەیە، دوای چاكو چۆنی یەکسەر گوتی: لیۆناردۆ بابرۆینەوە من پێم سەیر بوو..چووینەوە کەچی هێشتا نەگەیشتبوینەوە یەکسەر دەستی کردە قسەکردن. بۆکوێ؟! باوکم:"..ئا..ئەوە نیازم وایە **تۆ لە خوێندنێکی چاکتر بخوێنیو بەرەو "کەڤالۆنا" دەتنێرم..دەڵێن لەوێ خوێندن باشترەو مامۆستای چاکتری لێیە، شارێکی هێجگار خۆشەو پرییەتی لەکلێساو ئیماندارو خواپەرست"** هەر خۆی وەڵامی خۆی دەدایەوە.
**"ئا..شارێکی زۆر ئارامە تاك تاکەش پەرستگای موسڵمانی لێیە.."**
وەلێ بەقسەی خۆی هێندە نیین..هەرچۆنێك بێت باوەڕی پێهێنامو لەگەڵی چووم. بەڵام من ئەم بارەم پێخۆش نەبوو، ئەبێ چۆن ژیانێك بێت، لەشارێکدا بژیت پڕ بێت لە کلێساو قەشەو مەلاو مزگەوت..ئەمە چی!! ئەگەرچی گاڵتەم بەو جۆرە خوێندنەش دەهات..وەلێ دوای دوو رۆژ بۆ خوێندن بەرەو "کەڤالۆنا" بەرێکەوتم.

## -٢-

ئێوارەیەکی درەنگ وەختان تاریکی وردە وردە باڵی دەکێشاو منیش گەیشتمە کەڤالۆنا، کەسم نەدەناسی زۆریش قەڵەباڵغ، وەك بۆی وەسف کردبووم، زرمەی دەهات لە قەشەو کڵێسەو ترینگە ترینگو دەنگە دەنگی مزگەوت، واقم لەم زرمە زرمە وڕما؟!! هێشتا سەرەتامە، سەرم کاسو، گێژبووم..تەنها ئەدرەسی خوێندنگاکەم پێیە..لەبەر کڵێساو مزگەوت بەنەستەم ئەدەرسی خوێندنگاکە ئەدۆزرایەوە..کەناوی " کەڤالۆنا سکۆل" بوو..بە ئۆتۆمبیلێك بەرەو خوێندنگاکە بەرێ کەوتم، ئەدرەسەکەیم دایە شۆفێرەکەو چوار لیرەشم پێیدا..لەوێ لە یەکەم دیتنمدا مامۆستایەکی خوێندنگاکەم بینی، کاری وابوو کە ڕێنمایی خوێندکارەکان بکات، ئەمە کاری خۆی بوو دەیکرد، وادەی بەیانیم وەرگرت کە سەر بدەمەوە..سەیری خوێندنگاکەم کرد شوێنی خوێندنی لاهوتیە، لەوێوە زانیم، باوکم کە مەبەستی چییەو دەیەوێ ببم بە قەشەو کرینی بەهەشتیش لەرێگای خوێندنی منەوە مسۆگەربکات. شەو لە مۆتێلێك مامەوەو ڕۆژی دوایی سەرێکم لە خوێندنگاکەداو بەدوای ماڵدا گەڕامو کۆڵانەو کۆڵانم زۆرکردوو وا ڕێککەوت شوێنێك بگرم لە ژوورێکو نیو زیاتر نەبوو، لەگەڵ

کەسێکی تردا گرتم کە ناوی "گابرێل" بوو خەڵکی هەمان وڵات بوو..تەنها ئەوە نەبێ ئەو لە لادێوە هاتبووە شار، من بە نیسبەت ئەوانەوە یابانچی بووم، بۆنی پەتای بێگانەیم لێدەهات، خەڵکان بەسەیرەوە تەماشایان دەکردم، منیش هەمیشە بەگومانەوە سەیری خۆمم دەکرد.

بەیانیان لەو خوێندنگایەدا دەمانخوێند، خەڵك ئەو خوێندنگایەیان بە شوێنێکی باشی خوێندنی لاهوتی دەزانی، زۆر بەناوبانگ بوو لە سەرتاسەری وڵاتەوە خوێندکاری بۆ دەهاتن. شوێنی خوێندنگاکە کەوتبووە ناوەندی شارو، ئەگەرچی کۆڵانی پێچاوپێچی زۆربوو وەلێ گەلەك دڵگیر بوو..خۆش، پاركو گوڵی زۆری لێبوون، لەو خوێندنەدا کچو کوڕان بەیەکەوەیان دەخوێند، سەیربوو لاهوتیەتو پێکەوەبوونی کوڕوکچ..زۆر لە بەهەشت دەچوو..وەلێ رووت نەبووین جلمان لەبەربوون..مەلێ ئێمەیان رادەهێنا بۆ ئەوەی لە کلێساکانیش وەك راهیبو راهیبەو قەشەو شتی لەو جۆرە بەیەکەوەبین..جلی زۆرمان لەبەربوون..ساڵانە بەفرو بارانێکی زۆری دەگرت، شارەکەی خۆش دەکردو خۆیشی شارێکی پاك خاوێنو، رووبارێکی زۆرجوانی بەنێودا دەرۆیشت. بە رووبارەکەیان دەگوت "سراڤا"..ئەم دەزانی بۆوای پێدەڵێن..دوایی کە پرسیارم کرد مەبەستیان لە سراڤا ئاوی روون بوو، بەڵام زۆر جوان کەڤالۆنای کردبوو بە دوو کەرتەوە..چەندین پردو رێگای بۆکرابوون کەڵەكو

بەلەمی بچووکی تێدا دەجولاَن..لەلای خۆمانی دەکرد وەلیّ تراونای خۆمان بچوکتربوو..شوێنی خوێندنەکەمان زۆر لە ئاوەکە دوور نەبوو بەتایبەت بۆ من کە ئێواران دەچوومەوە ماڵ ئەبوا بەوێدا تێپەڕم. زۆر هەستم بەغوربەت دەکرد کەس نەدەبووە هاوڕێم..تەنها گابرێل نەبێت کە بەیەکەوە لەژوورێکدا بووین، کەس نەبوو کاروانی غەریبی خۆیم بۆ باس بکا..تەنیایی غوربەت لەغروبی خۆر، لە نەهاتنی مانگ..خەمزەدەیی ئەستێران لەغوربەتی منیان نەدەکرد، دووربوون لێم دوور..هەمیشە بیری خۆزێم دەکرد، چونکە کە رۆیشتم ئەوم نەبینییو نەمتوانی پێی بڵێم بۆ سەفەر دەچم.

ماڵەکەی ئێمە لەگەڵ ماڵێکی تردا بوو..خۆیان بەرەسەن خەڵکی کەڤالۆنا بوون..چەند ژوورێکیان هەبوو..تەنیا دەیاندایە ئەو خوێندکارانەی لەدوورەوە دەهاتن..هەموو خەرجی گرتنەکەیان نەدەدا..بەیانیان دەچووینە خوێندنو ئێوارانیش لەلای کابرایەکی میوەفرۆش کارم دەکرد..تەنها کارەکەم ئەوەبوو لەدواوەی دوکانەکە میوەکانم دەشۆردنەوەو دەمخستنە نێو سندوقەدارەکانەوە: خەیاڵم دەڕۆیشت..بیرم لەوە دەکردەوە مردوانیش کە دەشۆردرێنەوە، هەر دەخرێنە ناو سندوقی دارەوە، ئەبێ نهێنی سندوقی دار لای ئینسانەکان چیبێت؟ بۆ مردوان ناخەنە نێو سندوقی شوشە یان ئاسنەوە؟! ئەویش خەوێکی دیکەی کلێسەیە، ئەوە کاری دوای نیوەڕۆیانم بوو، کە زوو تەواو بوبام دەچوومەوە ماڵ..رۆژانەش بیست

لیرەی دەدامێ. .هەرچۆنێك بێت ئەو پارەیە بەشی بژێوی دەکردو ناکردم. .وەلێ هەر باش بوو. زیاتر لە نیو ساڵێکم بەو شێوەیە بەسەر برد. .ئەو ساڵەیان لە کەڤالۆنا سەرماو سۆڵەیەکی زۆر بوو، دەبوایە چاك خۆمان داپۆشین، جلوبەرگی پەمومان لەبەردەکرد. ژووری خوێندنەکە سۆپایەکی شڕی هەبوو، تا کورە خۆ باشە باش، بەڵام بەشی گەرمکردنەوەی نەدەکرد. خوێندکارەکانیش زۆر بوون. رۆژێکیان سۆزاریا کە لەگەڵ ئێمە لە لاهوت دەیخوێند، باسی ئەوەی بۆ کردم:" ئەو بەیانییە بەفر زۆر باریبوو، خۆمو براکەمو خوشکەکەم بەرەو خوێندنگا دەهاتین براکەم کە خۆی بە پیاوو مەزن دەزانی وردە وردە بەفرەلۆکی سەر رێگاکەی دەشکاند".

سۆزاریا دەیگوت:" بەفرەکە لەتاقەتی برا بچوکەکەم نەبوو، ماندوو ببوو، پەیتونێك بەوێدا تێپەڕی. .سەیرێکی ئێمەی کردو ماوەیەك رۆیشت، دوایی گەڕایەوەو منو براکەمی لە بەفرەکە دەرهێناو پانۆڵەکەی بۆ داکوتایینو لەسەر پەیتونەکەی دانایینو خوشکە گەورەکەشم بەدوای داشقەکەدا دەهات، رۆژێکی زۆر ساردبوو . .سەیر گەیشتین. .ئەگەر ئەو پیاوە نەبوایە نەماندەتوانی بگەین. .بەس باش بەهانامانەوە هات. .سوپاس بۆ تۆ خودایە".

رۆژێکیان لەپەنجەرەی ماڵەوە هەرچەند دەرزاویش بوو سەیری شەقامو کۆڵانم ئەکرد، رۆژێکی تەڕو باراناوی بوو خەڵکی بە بەر باراندا دەهاتنو ئەچوون، دیمەنێکی زۆر تەڕو جوانی هەبوو، خەریکی

سەیرکردنیان بووم..یەکێك بەدەنگی بەرزو زلەوە هاواری دەکرد، دیاربوو تەکسی کاربوو، لەولاوە بازاڕێکی سەوزەو میوە فرۆشی لێبوو، خەڵکی وردە وردە بۆی دەچوونو بەدەستی قەڵەباڵغ لێی دەهاتنەدەرەوە. جوان لەپەنجەرەکەم دەڕوانی..پەنجەرە بیرکردنەوەکانی والآ دەکردمو بەرەوخەیاڵە دوورەکانی دەبردم..منداڵانی دەستفرۆشیش شمەکیان لەوبەرو ئەوبەری شەقامەکە دەفرۆشت، کەسانی وەك منیشی لێبوو کە هەمان کاری منیان دەکرد، لەگەڵ خەیاڵی پەنجەرەدا تێکەڵم دەنگێك"..لەچی رادەمێنی..شار قەڵەباڵغە.."ئەو دەنگە..کە ناورم دایەوە..گابریێل بوو..پاش کەمێك بێدەنگی...ئا جوانە!

گابریێل: " **لیۆناردۆ غەریبی ولآتەکەت دەکەی؟ ئێرەش خۆشە..**" ئا دەزانم ..دەزانم ئەو رۆژەی یەکەمجارم بوو هاتبوومە کەڤالۆنا مامۆستاکەم بینی، هەمان پرسیاری لێکردم..مامۆستاکەم کە شارەدێکەی نیو سەعاتێك لە کەڤالۆنا دوورە، تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو، کەتەیەکی زل، هەردەم بە دەنگە گڕەکەی بانگی دەکردم: لیۆناردۆ چۆنی؟! ولآتەکەمان خۆشە؟! ئاخر دەزانم..بەس من قسەم نەدەکرد، بەڵام ولآتی منیش خۆشە..بێدەنگ دەبووینەوە..دوای وانەکان قسەی خۆشی بۆ دەکردین، خۆش مەشرەبو، سەمەرە بوو، وەلێ زۆر زەبەلاح..زەلام لێی دەترسا!

خوێندنەکەم دوای دوو ساڵ رووەو تەواو بوون دەچوو، کارەکەشم لەلای کابرای میوە فرۆش بەردەوامە، قەت نیگەرانی

نەدەکردم، خورەوشتمی بەدڵ بوو، لەوانەشە خۆم وانەبووبم. هەقم نەبوو بەسەر هیچ شتێکەوە کاری خۆم دەکردوو، ئێواران زوو دەگەڕامەوە ژووورە بچووکەکەمان. ئێوارەیەکیان زۆر غوربەتم هەڵسا، چونکێ رۆژانێکی زۆر بوو لە تراوناو ستیمۆر دوور کەوتومەتەوە. چەند رۆژێك بەر لەسەفەرەکەم خۆزێم زۆر بەداماوی لەو نامەیەدا بینی کە بۆی نوسیبووم" **هاوڕێم بەدوامدا مەگەڕێ زۆر بێتاقەت بووم دەرچوومە دەرەوە، نازانم بۆ کوێ دەڕۆم..لەکوێ دەنیشمەوە."** ئەو رۆژانەم بیردەهاتنەوە..ئەگەرچی کەڤالۆنا زۆر لە تراونا دەچوو، وەلێ برادەرە خۆشەویستەکانم لەوێ نەبوون.

دواجار بەر لەپشووی کۆتاییدا، کەڤالۆنا دواین رۆژەکانم بەسەربردنو بەرەو تراونای شاری خۆمان گەڕامەوە. دەمێك بوو وەدوور کەوتبوومەوە، زۆر شتم بیر نەماوە، بەرەو کۆڵانەکەی خۆمان دەچووم، وەك پێشان نەماوە، بەرامبەر پارکێکی فرەگەورەو پڕ لە گوڵو باغات، سەوزایی ئەو ناوەی تەنیبوو..هەستت دەکرد خودا خۆی جوانی کردووە! ئێواران خەڵکی لێکۆدەبوەوە، هەموو ئەو رۆژانەی بەر لە سەفەرم بیردەهاتنەوە کە ئەوێ پارك نەبوو، کاتی زۆرم لەوێ بەسەردەبرد. وردە وردە کۆڵانەکانو ماڵەکانم دەناسینەوە، هەندێ لەماڵەکان دەرگاکانیان گۆڕاون، پیاوە پیرەکە هەمیشە دەگوت"**کاتێ دەرگا دەگوڕێ..پەنجەرەکان داماوو درزاوی دەبنو رەنگی روونیان دەدەنە دەست خەمزەدەیەكو چاوەکانیان دەنوقێنن، لە ئەفسانەدا**

گۆڕانی دەرگا گۆڕانی ناخی ئینسانەکانە، بۆیە هەردەم دەرگاو پەنجەرەکان پەیوەندی رۆحیان لەگەڵ ئینساندا هەیە! لەپەنجەرەیەکەوە ویستمان تەعاروف لەگەڵ ژیان بکەین..ژیان..، کەچی ژیان بە بێدەنگیکی زۆرەوە لە ئێمە تێپەڕیبوو..خودا ئێمەی لەرەش‌و سپی دروست کردوو پێی گوتین: لەرێگای ژیانەوە رەنگەکان بناسنەوە، ئای خۆمان رەش‌و سپی‌و رەنگەکانی ژیانیش مات‌و خۆڵەمێشین..ئای خودای رەش‌و سپی..ئێمە چین!؟".

ناوی هەندێ هاوگەرەك‌و دراوسێکان هەبوون لەبیرم نەمابوون..نزیك دەبوومەوە، لەدوا کۆڵان کەماڵەکەمانی لێیە، نزیك دەبوومەوە بەرەو ماڵ چووم لەدرزی دەرگاکەوە سەیرێکی حەوشەی ماڵەوەم کرد..تەنها" لۆزاریا"و دایکم لەحەوشەن، کلێسە کۆنەکەی مەریەمیش هەروەك خۆی کۆن..یەکسەر بیرەوەرییەکانم فڕاندمییان‌و لەناکاو..دەرگام کوتا..دەنگە دەنگ‌و کێیە کێیەی کردوو، دەرگاکەی لێکردمەوە. دایکمەو باوەشمان بەیەکدا کردوو هەر لەدەرگاوە زۆر سەرو پرسیاری لێکردم.."لیۆناردۆ خوێندنەکەت هەواو کرد..شارەکە خۆش بوو..چۆن گەڕایتەوەو...؟؟! ".

ئەو کاتەی کە لە کەڤالۆنا هاتمەوە خوێندنی لاهوتیەتی مەسیحیم تەواو کرد، چونکە باوکم پێی خۆش بوو، پرسیاری "کریفا"ی خوشکم لێکرد..خەوتووە..باوکیشت لەکارکردنە؟! ئەی

ماریانا چۆنە بۆچی خەبەری نییە، بێدەنگ بوو..وەلآمی نەدامەوە لە بێدەنگیەکە گەیشتمو..منیش چیتر قسەم نەکرد.

پاش ئەو دووساڵی گەڕامەوە تراونا..برادەرەکانم خۆش دەویست، لەهەموویان زیاتر خۆزێم خۆشدەویست ئەو: جگە لە لیۆناردۆ هاوڕێی پازیاو پاولۆو نیکۆلاو لۆزاو ئالوناو لۆڤانا ساندراما بوو، زۆرم پێ خۆشە لەو چەند ساڵەی کە خۆزێم نەبینیوە، ئاگام لە ژیانی هەبێت.

-٣-

تراونا شارێکی دڵگیری بناری شاخی"کراوسا"، ئەو شارەی منو خۆزێ بەر لەهاتنمان بۆ ستیمۆر لێی دەژیاین، زێدی ئێمە بوو، منداڵیمان لەوێدا بەسەر بردوە، تراونا شاری هونەرو کلتوورە، ناوبانگێکی زۆری هەیە، لەهەر کوێیەکی وڵاتدا باسی بکرابایە دەیانناسی،" **یەکەم جار خۆزێو لیۆناردۆ لەیانەی هونەری مۆزیکدا یەکتریان ناسی**" منداڵ بوون خۆزێ کەمانچەژەنو لیۆرناردۆ پیانۆی دەژەنی. من جگە لەخۆزێ هاوڕێیەکی کچیشم خۆش دەویست کەمانچەژەن بوو..نا..ناوی ماریانایە.. لە سەر ئایینی ئێمە نەبوو. لە یانە موزیکیەکەدا بەشێکی کاتەکانی ڕۆژانەمان بەسەر دەبرد..مۆسیقامان لێدەدا. منداڵیمان لەوێ ڕۆحی بەبەر دەهاتو ئەبووە سەمایەکە بۆ ژیان، مۆسیقا مناڵیو تەنیاییمانی بەرۆح

دەسپارد. "ئای کە تەنیایی‌و منالّی‌و مۆسیقا چەندە هاورێی بێدەنگین.." لەو رۆژانە لەگەڵ خۆزێ زۆر لێك نزیك بووین، هەستم دەکرد ئەویش هەروا منی خۆشبوێت، سالآنێکی زۆر هاورێیەتی یەکترمان کرد، زەمەنی گریانی نێوانمانو پێکەنینی نێو دنیای منداڵیمان پێکەوە بەسەر برد. ئێواران لە تراوناو لە یانەکە یەکترمان دەبینی، موزیك هەناسە منداڵیەکانی ئێمەی لە نۆتەکان خۆشتردەویست، سروشت ئێمەی لە جوانییەکانی شار خۆشتر دەویست، فریشتەکان وەك ئێمە پاکیزە نەبوون، لیۆناردۆش ماریانی بێدەنگو خوست، زۆر خۆشدەویست. تراونای شاری هونەرو خۆشەویستی لیۆناردۆو خۆزێی هەبوون، منداڵانی دیکەی شاریش هونەریان خۆشدەویست، هەندێك نیگار کێش‌و هەندێك نمایشکارو هەندێکی تر مۆزیکوان بوون.

چەند رۆژێك بوو گەراببوومەوە، خوێندنی لاهوتیم تەواو کرد، لاهوتیەتم خۆشدەویست، لاهوتیەت باوەری بە موزیك هەبوو..مۆزیکی بە چێژی رۆح‌و بە جوانیەکانی خودا دەزانی. ئەگەرچی پێویستە کارێك بکەم‌و وا بەتەمەڵی دانەنیشم، بەلآم لەو ماوەیەدا هەر لە ماڵەوە دادەنیشتم. ئێوارەیەك لەباخچەکەی ماڵەوەمان کە لەتەنیشت کلێسەی مەریەم بوو دانیشتووم..لەدەرگا درا..چوومە دەرگا زۆر خۆشحالّم بینیم خۆزێ‌و پاولۆی هاورێی بوون، گەشامەوە..منداڵی خۆمم بیردەکەوتەوە ئەورۆژانەی: "خۆزێ‌و

**لیۆناردۆ لەیانەی موزیکدا پێکەوە کاریان کردبوو."** لێرەوە جارێکی تر خۆزێم بینیەوە، سەرو پرسیاری سەفەری لێکردمو هەموویم بۆ گێڕایـــــــەوە..ساتەخۆشـــــــەکانی کـــــەڤالۆنا، دیمەنـــــــە جوانەکانی..هەمووی..هەمووییم بۆ گێڕایـەوە..منـیش پرسیاری زۆرم لەو کرد.

ئەو کات لە سیتمۆر دادەنیشتم، پێم سەیر بوو کە خۆزێ لەتراوناوە بۆ هاتۆتە سیتمۆر، دوایی بەدەرکەوت خۆزی لەیەکێك لە کۆلێـژەکانی زانکۆی سیتمۆر دەیخوێند. ئەو ئێوارەیە: **"لیۆناردۆ کەمتر قسەی لەگەڵ پاولۆ کرد، زۆر تێکەڵی نەبوو، ئەو رۆژەیان بە باسو خواسی سەفەر بەرێکرد".** رۆژهاتنو چوون..زۆرم پێخۆش بوو لەژیانی خۆزی بگەم. مەبەستمە لەو هاوڕێیەی منداڵیم بگەمو چیتر نا..

لەو ساڵەدا، خۆزێ میلۆنای هاوڕێی خۆی پێناساندم کە لەکۆلێژ بوو، دوای خوێندن لەبەر بژێوی لە وێستگەی کارۆئاوی شارەکە کاری دەکردو بەیانیان دەیخوێند. شەوان هەر لە وێستگەکە دەمایەوە باوکی ئاغی پازیا کاسبکار بوو، لۆزاو ئالونا کە لەگەڵی لە کۆلێژ دەیانخواند، باوکی لۆزا قەشەو خۆشی گیتار ژەن بوو، باوکی ئالوناش مردبوو، لۆڤانا کەهاوڕێیەکی ترە لەبەشی زمان دەیخوێند، باوکی بەدەستی تورکەکان لەڕووداوێکدا کوژرابوو، هەموویان دایکیان هەبوو، خۆزیش باوکی فەرمانبەرو دایکیی مامۆستا بوو خوشکێکو

برایەکی بچووکی هەن، براکەی تریشی نیگار کێشەو، ناوی گۆتیە. تەنها من خوێندنم تەواو کردبوو. **"هەموویان لەستیمۆر دادەنیشتن. خۆزێو میلۆنا هاوشاری لیۆناردۆ بوون".**

لەگەڵ خۆزێ بووینەوە هاورێی یەکتر، زۆرجار هەفتەی زیاتر لەجارێك سەرمان لەیەکتر دەدا، خۆشەویستیمان بۆ یەکتر بەرادەیەکی زۆرە. خەڵك هەبوون: **"پێیان ناخۆش بوو، کەلیۆناردۆو خۆزێ وایەکتریان خۆشدەویێت؟! شەوو رۆژ بەیەکەوە بوون، ئەوکات لیۆناردۆ لەرۆژنامەیەکی کۆمۆنیستی شاری سیتمۆر کاری دەکرد، خۆی کۆمۆنیست نەبوو، بەڵآن لەوێ کاری دەکرد".**

**لیۆناردۆ دەیگوت:"بۆمن ئەوێ باشتر بوو، ئەگەرچی موچەکەشی کەم بوو، وەلێ ئازادتر بووم".**

لیۆناردۆیان زۆر بانگی ئەمنیەت دەکردو سەرو پرسیاری سیاسیان لێ دەکرد، وایان ناسیبوو، کەسێکی سیاسیەو لەوانەیە دەستی لەنائارامیەکانی سیمتۆردا هەبێت.

تازە گەڕابوومەوە: گوێم پێ نەدەدا خۆزێ زۆرجار دەهاتە رۆژنامە کۆمۆنیستیەکەو سەری لێ دەدام...وای لێهات خۆزێ...بەشێکی گەورەی ژیانی منی پێك هێنا..بەتایبەت: **"کەهاورێی لیۆناردۆ لەوڵات نەمابوو، خۆزێ زۆر دڵنەوایی دەکرد".** لەگەڵ خۆزێ سەروپرسیاری ژیانی یەکترمان زۆر دەکرد، زۆرجار لەمەشروبخانەکەی سیتمۆر دادەنیشتین، **"ئەوێ کۆفیێو مەشرەبخانەشە**

**سیتمۆر شارێکە کەمتر موسڵمانی تێدایە".** لیۆناردۆو خۆزێو زۆرینەی دانیشتوانی کریستیان بوون، شەوێکیان وەك جاری جاران چوونە مەشروبخانەکەی لای ماڵی ئەوان، کەچەند کۆلانێك لەخوار کلێسەکەوە بوو، ئەو ئێوارەیە لیۆناردۆ زۆر داماوو وێران بوو.

**" خۆزێ دەیزانی ماریانام خۆشدەوێت، دەمێك بوو نەمبینی بوو"**...

لیۆناردۆو ماریانا چەند ساڵێك لە تراونا بەیەکەوە ژیا بوون، بەر لەسەفەریش لیۆناردۆ دڵی بەماریاناوە بوو، زۆرجار باسی ماریانای خۆشەویستی بۆ دەکردم، دەمێکیش بوو هاتبووەوە، کەچی ماریانا...نازانم بۆ ئەم باسەی دەست پێ کرد.

خۆزێ: **"هەستم کرد لیۆناردۆ بەبێ ماریانا زۆر تەنیایی پێوە دیارە"** لیۆناردۆ دەیگوت: زۆرم خۆشدەوێت..هەستم کرد ئەویش هەروا.

لیۆناردۆ: خۆزێ ..رۆژانێکی زۆرمان لەتەمەنی منداڵیو زیاتر لەحەوت ساڵی بەر لەئێستامان بەیەکەوە بەسەر برد.

**"تا..ماریاناش ماڵی لەتراونا بوو، بەڵام لەئەسڵدا خەڵکی ئەوێ نەبوو".**

شەوانێکی زۆر بەیەکەوە دەبووین، ئەو کاتەی لەسەفەر دێتەوە هیچ کارێك ناکەم تەنها دەمەوێت ئاگام لێی بێت..ئەو کاتیش هەر لەرۆژنامە کۆمۆنیستیەکە کارم دەکرد، ماڵەکەی ماریانا کەچەند

کۆلانێك لـە مـاڵی ئێمـە دوور بـوو، هەمیـشە دەهاتـە لام، ئـەو زۆر شارەزای ماڵی ئێمەیە، لەژووره گەورەکەی ماڵەوە دەخەوتم، ژوورێکی گەورەو دوو دەرگـای هـەبوو، هـەرکات دەرگایـەکم دادەخـست، بـەلام ماریانـا دەیزانـی کـام دەرگـا کراوەیـە، شـەوان دەهاتـە لام، تـاوەکو درەنگانێك پێکەوە دەبووین، شەوانێکی خۆشمان بەسەر دەبرد، لەسـەر یەك جێگـا دەخـەوتین، زۆرمـان قـسەی خـۆش دەکـرد، زۆرمـان حـەز لەماچـی یـەکتر بـوو، لەماچـی ئـاوو ماسـی، ئـەو یارییـکـە خۆمـان دامانهێنـاوە شـەوانێکی پـڕ لـەیادەوەرین، ماریانـام خۆشدەویـست، خـۆزی مەسـت نـیم بـەلام خـەوێکی خۆشـت بـۆ دەگێڕمـەوە، یـان نا..گومـانم هەیـە خەوەکـە خـۆش بووبێـت.تـابزانی ماریانـام چـەند خۆشدەوێت، سەیرە ئێـستا بیرم دەکەوێتـەوە، چـەند رۆژێکـیش دوای هاتنەوەم لەدایکم پرسی ماریانا لەکوێیەو چۆنە؟...وەلامی نەدامـەوە ئەمـەیان دوایـی بـۆت بـاس دەکـەم، چـونکە نەمـدەزانی ماڵەکـەیان لەتراونا نەماوە.

ئـەو ئێوارانـەی کـە ماریانـام لادەبـوو، تادرەنگـە شـەوێك دەمایـەوەو دوای رۆیـشتنی چـراکانم دەکوژاندنـەوە، ئـەو شـەوەیان رۆیشتو چاوم چووبووە خـەو، لـەناکاوا هەسـتم کـرد یـەکێك بـانگی کـردم، زوو بـەناگا نـەهاتم چـەند جارێـك بـانگی کردمـەوە، "لیۆنـاردۆ...لیۆنـاردۆ..." چـونکە ماریانـام بـەر لەسـەعاتێك لابـوو، ..ئـەبێ ئـەو بێـت.چـاوم هـەڵێنا...هەسـتم کـرد دەنگـی

مارینانایـە!! هـا..هـا ماریانـا تۆییـت..چیـەکەیت. ئەرۆیـشتووی...

**ماریانا "با..بەلاّم گەڕامەوە دەمزانـی خـەوتوویت..بـەلاّم لیۆنـاردۆ دەمەویّ دلّنیابم لە خۆشەویستیت".**

خوزیّ: ماریانا ئەمە چۆن پرسیارێکە بەم شەوە؟!

ماریانا چۆن دلّنیا نیت. تۆم خۆشدەویّت..

ئای کەتۆم خۆشدەویّت بۆت بنوسم! بۆت بلّیّم..نا..ئەی چی؟!

ژوورەکـە زۆر تاریکـە، بەئاسـتەم رووی یـەکترمان دەدیـت، قسەکانیش زۆر بەهەناسە برِکیّوە دەهاتنە دەرەوە، لەژوورەکەدا چـەند کورسیەك‌و چرایەك هەبوون، چراکە هەلّنەکراوە، ماریانـا کـەهاتبووەوە چـراکەی دانەگیرسـاندۆتەوە، هەسـتم دەکـرد منـی زۆر خۆشـدەویّت، نەمدەزانی چۆن دلّنیای کەمەوە..ئای خۆزیّ نەمـدەزانی..وەك جـاران هاتە سەرجیّگام..مانگە شـەو لەپەنجەرەکـەوە بەرەبـەرە دەردەکـەوت، لەسـەر جیّگاکـەی دەدا، ماریانـا هەسـتایەوەو پـەردەکانی داخـست. گوتم: باشە ئەمشەو تاوەکو بەیانی لەگەلّ من بخەوە، وەکو جاران هاتە باوەشم‌و منیش بۆ ئـەوەی دلّنیابیّـت لەخۆشـەویـستیم تونـد لەباوەشـم گرت.

ماریانا: لیۆناردۆ ئەم شەو شەریعەت‌و سنورەکان تیّك دەدەم.

لیۆناردۆ: نابیّت ماریانا..ماریانا تیّناگەم ئەم قسانەت مانای چین؟!

من دەمەویّ تەنها بەقسەی خۆم بکەم ..

چۆن؟!

نازانم ماریانا..چیت دەوێت باوا بمێنینەوە..هەر لەباوەشی یەکتر دابوون، شوێنی یەکتر نەدەما ماچی نەکەین، بەهێواشی تاریکیەکە روون دەبووەوە بێ چرا ژوورەکە رووناك داهاتو ماریاناو لیۆناردۆ رووت ببوونەوە..عەشق بەدەوری رووناکیەکانی جەستەیانەوە دیاربوو، بێ ناگایی خەوێکی گەورەیە.. ماریانا ..لیۆناردۆ... ئا...نا.... ماریانا... هنسکەکان تەنها هەناسەی تاریکی شەوبوون ..چۆن دڵنیا دەبیت..ماریانا با پەلە لەخۆشیەکان نەکەین..خۆشەویستی هەردەم پیرمان دەکات..با پەلەی لێ نەکەین..ماریانا..

ئەو پیاوە پیرەی لە کەڤالۆنا جارێك بینیمو ناسیم..دەیگوت: **"کەسێك کەلاو بوو ئەو قسەی بۆ دەکردم، ئەو کاتەی جەوانێك بەبەر باراندا دەرۆیشت، دەیگووت..خۆشەویستی پیرمان دەکات! کاتێکیش دەمانەوێ گەنجمان بکاتەوە، گەنجێتی مانای نەماوە، ئەو کاتەیە.."**.

ئا خۆزێ کە جەوانی نێو خۆشەویستینو هەر پیریش دیارین، خۆشەویستی پیرمان دەکات، دوایش دەزانین چێژمان لەگەنجێتی خۆمان نەدیوە. ئەو شەوە بیرت نەچێ خۆزێ واخەونەکەم دەگێرمەوە. خەونێکی سەیر..دەمێکە من ماریانام نەدیوە..دەمێکە ژیانم لێبووە بەخەون قسەکانم بێ سەروبەر بوون، نازانم ئەم شەوە دەبێ خەون بێت..یان نا...ئای خۆزێ بۆیە ماریانام زۆر خۆشدەوێت..چونکە ئینسانێکە قوربانی بۆ دڵنیاییەکانی خۆی دەدا، نەیدەویست بەتەنهاو

بەگومانەوە بژیت..زۆرجار لەکلێسەکەی لای ماڵی ئێمە پێکەوە دەچووینە ژوورێ..ماریانا دەپاڕایەوە..لەیەسوع..لەمەریەم، کە فێری بکەن بەتەنیا بژیت..دوای دەیگوت.. **"ئا..منی ئینسان ناتوانم بەتەنیا بژیم، تەنیایی دەمکوژێ..دەستی بۆ ئینجیل دەبردوو دەیگووت: خودا..من لە لیۆناردۆ دڵنیام خۆشیدەوێمو خۆشمدەوێت..وەکو یوسوع خۆشمدەوێت..تۆش بەتەنیا دەزانی دڵنیایم لە چییەوەیە؟!"**.

..ئا..لیۆناردۆ ئاخێکی قوڵی هەڵدەکێشاو دەیگوت: ماریانام لەرۆحەوە خۆشدەوێت..دیارە نەیزانیووە ئێستا من گەڕاومەتەوە سیتمۆر..بۆ؟!

نازانم بۆ چ لەمەشروبخانەکە بەدەم ئەو قسانەوە خۆزێو لیۆناردۆ دانیشتبوونو دەگریان. خۆزێ وردە وردە لەبەرامبەردا دەگریا، هەستم بەتەنیاییەکانی خۆمو خۆزێ دەکرد، هەستم کرد خۆزێ کەسێکی خۆشبووێت..بەلام نەمدەزانی کێیە؟! ئەو شەوەمان بەرێ کرد، زۆر جاری تریش بەیەکەوە بووینو قسەی تریشمان دەکرد، تارۆژێکیان خۆزێ باسی خۆی بۆ کردم، کە ئەو هاوڕێی لۆڤاناو لۆزاو ئالۆنایەو هەموشیانی خۆشدەوێن، خۆزێ ئاسۆری هاوڕێکانی بەهی خۆی دەزانی، زۆریش خاوەن سۆز، لەرۆحەوە تێکەڵ دەبوو، زۆر رقیشی لەپیرۆزیەکانە، بەلام هاوڕێکانی زۆر لا پیرۆز بوون.

**"تــەنها کەســێك کــەبۆی هــەبوو قــسە لــەژیانی خــۆزێ بکات..لیۆناردۆ بوو؟! ڕۆژانێك کەخۆزێ زۆر لە میلۆناو پاولۆ نزیك بوو..پێی گووتبوون..نابێ بە هیچ شێوەیەك قسە لەژیانی من بکەن، نــابێ قــسە لــە لــۆزاو ئالۆنــاو لۆڤانــاو پەیوەنــدیان بەمنــەوە بکــەن..ســەردەمێك خــۆزێ...لۆڤانــای زۆر خــۆش ویــستبوو"**، ئــەو کاتــەش کــەمن‌و خــۆزێ هــاورێ بــووین..لۆڤانــای هــەر خۆشدەویــست بــەڵام..کــەخۆی بــۆی باســکردم لەبــەر چــەند شــتێك کــە پەیوەنــدی بەخۆیانەوە بوو..نێوانیــان ســارد ببــوو..خــۆزێ لیۆنــاردۆی بــە لۆڤانــا ناساند..چەند ساتێك بەر لەو ناساندنە..لیۆنــاردۆ لۆڤانــای لــەدەرگای کتێبخانەی شاری سیتمۆر ناسیبوو، **"سەیربوو بێ ئەوەی یەکتربناسین دەفتەرەکــەی دەرگــای کتێبخانــە قەڵــەمی لەســەر نــەبوو، یــان نەیدەنووسی ..بۆیە لیۆناردۆ قەڵەمەکەی بە لۆڤانا دابوو، تەنها ئەو کاتەش قسەیان بەیەکەوە کردبوو"**.

کە چــووینە ژوورەوە ســەیرم کــرد میلۆنــاو کــچێکی هــاورێی، لەگەڵ خۆزێ چاوەڕێی ئێمە بوون. لۆڤانا بەرلەمن گەیشتە ئەوێ، ئەو ڕۆژە بارانێکی زۆر باریبوو، کەشی ســاردی کتێبخانەکــە چێژی خــۆی هەبوو، سڕی دەکردی هاتبووینە کتێبخانەکە تا هەمووومان بەگروپێك کاربکــەین..ســەروســەوداەمان لەگــەڵ کتێبــدا هــەبوو، خۆمــان وەك پاڵەوانی نێو ڕۆمانــەکان دەبینــی زۆر ئاشــنای کتێــب بــووین، لەگــەڵ

کوڕو کچانی سیتمۆر کتێبمان دەگۆڕیەوە، واڕاهاتبووین کە داستانی خۆشەویستی‌و ئەفسانەکانی ژیانمان لەکتێبەکانەوە دەناسین، دنیایەکی پڕ خەون‌و خەیاڵمان لا دروست ببوو، نومێدمان بەژیان هەیە، بەئومێدەوە دەژیاین، لە سیتمۆر خەڵکانێکی کەم هەن وەکو ئێمە بن‌و نومێدیان بەژیان‌و ئایندە هەبێت، جگە لەکتێبخانەکەی سیتمۆر، ماڵێکی رۆشنبیری تریش هەیە، سەردەمانێك کچ‌و کوڕی شار لێی دادەنیشتن، کۆفییێکی قەڵباڵغیشە، ئێمە لەوێ یەکترمان دەبینی. وای لێهاتبوو لیۆناردۆو خۆزێ بەردەوام لەوێ بوون‌و هاورێکانیان لەوێ دەیاندیتن، مۆزیکارو نیگارکێشی زۆرمان دەناسین، زۆرجار لەهۆڵی خوێندنەوەکەدا سکێچی دەم‌و چاوی ئێمەیان دەکێشا، لەوێ هونەرمەندی زۆری لێ بوون..هەمیشە لەوێ دەماینەوە..تاوەکو کەمانچە لێدەدرا، نیگار دەکێشرا، دەمانخوێندەوە.

- ٥ -

خۆزێ بە کەمانچەکەیەوە دەهات‌و چەند ساتێك مۆسیقای لێدەدا، جارنا جاریش شیعرمان دەخوێندنەوە، مۆسیقا ئەفسانەی منداڵی‌و تەنیاییەکان بوو، سروشت ئێمەی لە جوانییەکانی شار خۆشتر دەویست، ئەگەرچی گەورە بوو بووین‌و سەردەمی منداڵی تراونا نەبوو، مۆسیقا لەنۆتەکانی خۆشتریدەویستین، شیعریش شێتیەکانی ناخ‌و خەیاڵی ئێمە بوو.

له کەڤالۆنا پیاوە پیرەکە رۆژێکیان وای گووت:" ئەوانەی مۆسیقایان خۆشدەوێت ئینسانەکانیشیان لە روحەوە خۆشدەوێت"، مۆسیقا بەشێك لە تەنیاییەکانی ئێمەی خەمزەدەیە، ئیدی لەگەڵ لۆڤانا زیاتر بووین بە هۆگری یەکتر، دەیزانی کە منو خۆزێ چەندە هاورێین، ئەگەرچی خۆزێ پێشتر پێیگوتبووم کە بە پاولۆو میلۆنای گووتووە "قسە لە ژیانی من ناکەن.."بەدرێژی باسی بۆ کردبووم.

رۆژێکیان لۆڤانای خۆشەویستی خۆزێ کە لەتراونا هاتبووەوە لەماڵەکەی خۆی لە سیتمۆر زویر ببوو، ئێوارەکەی بە کۆڵانی لای کڵیسەکەدا بەرەو ماڵی ئێمە دەهات، زۆر خۆشحاڵم کە هاتوە، بەڵام ئەو شەوە سەیر رێککەوتبوو دایكو باوکی ماریانا کە ماوەیەکی زۆردەبێت نەهاتبوونە لای ئێمە لەماڵی ئێمە بوون، هەستیشم دەکرد کە ئەوان دەزانن لۆڤانام خۆشدەوێت، بۆیە زۆر هەراسان ببووم، بە هەر شێوەیەك بێت وامکرد نەزانن لۆڤانا هاتۆتە لای من، ئەو ئێوارەیە لۆڤانا زۆر بێتەقەتو ، پرِوکابوو، گوتی: "لیۆناردۆ..ببوورە هاتوومەتە ماڵتان دەزانم پرسم نەکردووە.." ئەو قسەیەم پێناخۆش بوو..گوتی :"پێمخۆش دەبوو ئەم شەو خۆزێش لێرە بووایە، زۆر پێویستم بەوە هەیە خۆزێ ببینم..

" من هیچ دەنگم نەکرد..چونکە خۆزێ گوتبووی نابێت قسە لەو مەسەلەیە بکەیت. من خۆزێم لەرۆحەوە خۆشدەویست. نەشم دەتوانی بانگی بکەم..ئەو شەوە لۆڤانا لەلای من مایەوە دایكو

باوکی ماریانـای خۆشەویستم پێیـان نـەزانی..بـەیانی لۆڤانـام بـەری کرد..

دوای ئەو شەوە چەند قسەیەکم لەگـەڵ خـۆزێ کـرد، پرسـیاری ئـەوەم لێکـرد کـە بـۆ لەگـەڵ لۆڤانـا زوویـر بـووە، خـۆزێ بێـدەنگی هەڵبـژارد..زۆر بـە ئەسـپایی قـسەی دەکـرد. بێـدەنگ دەبـوو، مـن دەمویست قسەبکات..ئاخی هەڵدەکێشاو بێدەنگ دەبوو..دواجار بەهنسکەوە قسەی دەکرد..گوێم لێگرت،." ئا..لیۆناردۆ من لۆڤانام لەرێی زەنگێکی تەلەفۆنەوە ناسی کە بەهەڵە کرابوو، بووین بەهاورێ زۆرم خۆشدەوێت، هـاورێ بـووینو زیـاتریش..، چـەندین شـەوو رۆژ بەیەکـەوە بـووین بەتـەنیا لەژوورەکـەی مـن دەمایـنـەوە لـەتراونا، پەیوەندییـەکی روحـی زۆرمـان بەیەکـەوە هـەبوو"، بێـدەنگ دەبوەوە..دوایی دەیگوت:" رۆژێك لۆڤانا زۆر بـە دڵ رەقـی پێگـوتم: "هاورێیـەتی منوتـۆ لەسـەر پێویـستی بوونمانـە بەیـەکتر، بەرژەوەندییەکان وادەخوازن.."منو تۆ هـاورێن لۆڤانـام خۆشـدەوێت کەچی لەسەر ئەو قسانەی زویر بووم. کاتێـك مـن بەعیـشقەوە لەبـەر دەمی لۆڤانا دەگریام، گوتی:" من خۆشحاڵم کە کورێك لەبەر دەمی من دەگرییێت"، لیۆناردۆ ئەوەتا نامەکانت پیشان بدەم لەگـەڵ لۆڤانـا دۆست بووین، لەناخەوە خۆشمدەویست. من ئێستا ناتوانم وەك دۆسـت خۆشمبوێتو بۆ یەکتر نەبین، من هەرگیز خۆشەویستی واناکـەم، تـەنها ئەبێ هاورێبین، ئەو تێمناگات من خۆشمدەوێت.

هەستم کرد خۆزێ قسە دەکاتو چاوی پڕبووە لەگریان..نا ..قوڵپی دەدا..منیش دڵم پڕبوو.."نا لیۆناردۆ جارێکیان لۆڤانا بەغوربەتەوە گوتی زەمەنێکە هاوڕێن بۆ جارێکیش لەباوەشت نەگرتم، نەمدەزانی بڵێم چی..نا ...گوتم" چونکە دڵنیا نیم لەوەی ئایندە بۆ ژیانی ئێمەیەو هاوڕێیەتی پاکم پێ قەبوڵترە".

لەزۆر لە قسەکاندا لەگەڵ خۆزێ بووم، بەڵام لۆڤاناشم وەك هاوڕێیەك تەنیا دەبینی. هەستیشم دەکرد کە خۆزێ لە ژیانێکی تەنیاو هەراساندا دەژی، ئەو شەوە قسەکانی بۆ تەواو نەکردم، خۆشم نەمدەویست لەوە زیاتر قسەبکات..گوتی" لەبەر ئەم قسانەو زیاتریش..ناکرێ لیۆناردۆ..ناکرێ قسە لە مەسەلەی لۆڤانا بکەین.." باشە خۆزێ هەڵیدەگرین..ئەم قسانەی تر هەڵدەگرین..با تۆزێ بێدەنگ بین.

ئەو شەوە دڵگیربووم کە خۆزێ نەیدەویست هیچ قسەیەك لەوبارەیەوە بکەم، هەرچۆنێك بوو باسەکەم گۆڕی..هەرچەند جارناجار بەدەمیدا دەهات دەمگوت: ئاخر هەست دەکەم لۆڤانا تۆی خۆشدەوێت..تۆی وەك دۆست خۆشدەوێت. خۆزێ بەتوڕەییەوە دەیگوت:" نا..لیۆناردۆ نا..لۆزاو ئالوناشم وەکو لۆڤانا خۆشدەوێن". هەر چۆنێك بوو ئەوشەوەمان کردەوەو گەیشتینە بەرەبەیان. چیتر من باسم لەوە نەکردەوە. زیاتر لە ساڵێکی بەسەرچوو، زۆر دەچوومە شاری" ڤلۆڤارا" بێدەنگ لە مەسەلەی خۆزێو لۆڤانا، رۆژی ٦دیسێمبەری ١٩٠٠ بوو یان سەدەیەك بەر لەئێستا بوو کە لەدوا سەفەری شاری"ڤلۆڤارا" دەگەڕامەوە.

-٦-

هەر لەرۆژنامــە کۆمۆنیــستیەکە کــارم دەکــرد، جارنــا جارێــك هاورێکانی ترم دەبینی چ لۆزانـا یـان ئالونـا، زیـاتر لۆڤانـاو خـۆزێو میلۆنا سەریان لێدەدام، کاتێکی خۆشمان لەوێ بەسـەر دەبـرد، لۆڤانـا هەندێك جار کاری وەرگێرانی دەکرد، ئـەو زمـانی پەهلـەوی دەزانـی، چـونکە سـەردەمانێك ماڵیـان لـە قاجـار بوو،نوسـینو وەرگێرانـەکانی لەرۆژنامـەکەی ئێمەدا بڵاودەکردەوە، خـۆزێش لـەوێ لەسـەر مۆسـیقا دەینووسـی میلۆنـا زیـاتر شـیعرو چـیرۆکی لەرۆژنامەکـەی ئێمــەدا بڵاودەکردەوە، کۆمنیـست نـەبووم، نـازانم بـۆ دەمـەوێ جـەخت لـەوە بکەمــەوە..بــەڵام لــەوێ کــارم دەکــرد، خۆزێــشم زۆر خۆشدەویــست. زۆریشم پێخۆش بـوو زۆرتـرین جـار دەهاتـە لام، کـە بـۆ " ڤلۆڤـارا" دەچووم چەند رۆژێکم پێدەچوو، بەر لەوە لەگەڵ خۆزێدا زۆر باسی ئەو سـەفەرەمان کـرد، باسـی ئاسـیاوانی ئـەوێمان دەکـرد، هـەردووکمان دەمانناسین، یادگاری خۆشمان پێکەوە هـەبوو، هەسـتم بـەهیچ شـتێك نەدەکرد، چونکە تاکە کەسێك کە من جارناجار قسەم لەسەر دەکـردو خۆزێ پێیناخۆش بوو، مەسەلەی لۆڤانا بوو. دەمێکیشە لەگەڵ خۆزێ ئەم باسەم نەکردوە. چونکە خـۆزێ پێگوتبـوومو منـیش نەمدەویـست لەسەر باسێك کە پەیوەندییەکی کـەمی بەمنـەوە هـەبوو دڵـی خـۆزێ بـشکێنم. ئـەویش لەوانەیـە هەسـتی بـەوەکردبێت..لـەدوای ماریانـا

خۆزێم وەك هاوڕێیەك خۆشدەویست، جاری وا هەستم دەکرد لەخۆم خۆشتردەوێت.. **"ئای خۆزێ پەیوەندییە روحیەکانی ئینسان هەردەم لەشوشەن، زۆر تەنکن، هەموو کەسێکیش شتی جوانی خۆی هەیە"**. زۆرجار پرسیارم دەکرد..نەبێ منیش شتێکم نەبێت لام موقەدەس بێت؟ دەشمزانی منو هەموو ئینسانەکانی تریش شتی پیرۆزی خۆمان هەیە، جوانی خۆیان هەیە، بەڵام هەیە دەنگ دەکاتو هەیە دەنگ ناکات. هەردەمیش بێدەنگی جوانتربووە..یەکەمجار کە پیاوە پیرەکەی کەڤالۆنام ناسی بۆی گێڕامەوە: **"ئەوانەی زیاد لە پێویست ژیانیان خۆشدەوێت، دوارۆژ یان شێت دەبن یان خۆیان دەکوژن"**، نازانم ئەو پیاوە پیرە سەرشێتە بۆ وای گوت، بەڵام شێتەکان جوانی خۆیان هەیە! دنیای ئەوان دنیای جوانیو پاکیو بێگومانییە، ئەوان کە شێتن تەنها گومانێك کە هەیان بێت، گومانە لەخودی خۆیانو لە عاقڵیی ئێمە. پرسیارکردنیانە لە بوون، گومان لەبوونی ژیانێکی پڕگومان دەکەن!! ئەوان شێتنو گومانیان لە ئینسانە عاقڵەکانو لە ژیان هەیە.

٦ دیسێمبەری ١٩٠٠، ئێوارەیەو، تازە خۆر بەرەو ئاوابوون دەچێت، زۆرماندووبووم..لە ڤلۆڤارا دەگەڕامەوە ٢٥ رۆژی مابوو بۆ کریسمسی ١٩٠١، لەسەر رێگای هاتنەوەم کە بەلای ماڵی خۆزێدا، سەرێکم بەماڵی خۆزێدا کرد..زۆردانەنیشتم چەند قسەیەکمان کردوو زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا، خۆزێ تەلەفۆنەکەی هەڵگرت کە هاتەوە لام گوتی: **"دایکت بوو"** پێم سەیر بوو،خۆزێ" ئەوە لەماڵەوە

**نەتگوتووە سەفەر دەکەم؟** ..نا..خۆزێ نا..خۆت دەزانی دایکم چەند بەسەفەرکردنی من تەنگاو دەبێت، بۆیە باسم نەکردووە.

خۆزی بەلیۆناردۆی گوت: "**بچۆرەوە ماڵو میوانیشت هەیە**"

لیۆناردۆ چۆن؟ کێییە؟

ئەوەها تۆ دەتەوێت پێم بڵێیت، زۆریم لێی کرد گوتی: "**لۆڤانایە! ئێ باشە تۆش وەرە بابڕۆین، دیاربوو پێشتر وەعدی بە ماڵێکی دیکەدابوو، کە بۆ نان خواردن بچێتە ئەوێ..لەدڵەوە هەستم کرد شڵەژاوە، ئەبێ بۆچی لۆڤانا هاتبێتە لای لیۆناردۆ!؟**" من چونکە خۆزێم لەناخەوە خۆشدەویست، هەستم بە قسەکانی ناوەوەی دەکرد. گوێم لە قسەکانی ناخی دەبوو، هاتینە سەر جادەکەو، بە ئۆتۆمبیلێك رووەو ماڵی ئێمە هاتین کە چەند کۆڵانێك لەخوار کڵێسەکەوە بوو، لەرێگا خۆزێ دابەزیو پێم گوت چاوەڕوانم.."**باشە..چاوەڕێ بە ..**" چاوەڕێ بووم.

چونکە وارێککەوتین خۆزێ ئەو شەو هەر سەربدات. شەو زووانێك چاوەڕێم کرد.

کەچوومەوە ماڵ لۆڤانا دانیشتبوو..دوای چاك‌و چۆنی ..بابچینە ژوورەکەم، لۆڤانا سەرەتا گوتی :"**دانیشتووم..ئێرەش خۆشە..**" زۆریم لێکرد چونکە نەمزانی پێیخۆشە بەتەنیا دابنیشێت‌و منیش دەمویست زوو پرسیاری هاتنی لێبکەم. دوای نانخواردن کەوتینە قسەوباس..زۆر لە قسە خۆشەکانی جارانم بۆ گێڕانەوە

پێدەکەنین..باسی ژیانو تەنیاییەکانی مرۆڤمان دەکرد، سەیری یەکە یەکەی رەسمی ئەلبومو رۆژگارەکانیانمان دەکرد، جارناجار لۆڤانا لە کەسەکانی دەپرسیو ..وەلامم دەدایەوەو تێدەپەڕین..لۆڤانا نەیدەزانی خۆزێ دێت. بەلام دەیگوت **"بۆ سەیری سعاتەکە دەکەی چۆن بلێیت چاوەڕێی کەسێکیت"**، ئا..هەروا سەیری کات دەکەم کات بەرەو تاریکی دەچوو، بەرێکی لە سەعات ٨,٥ی تێپەراندبوو.

**"لیۆناردۆ هەر چاوەڕێی خۆزێ بوو زۆری پێخۆش بوو ئەو شەوەو لەمالی ئەو لەگەل لۆڤانا چەند قسەیەك بکەن..بە هەلی دەزانی هەردووکیان لەلای ئەونو قسە لەگەل یەك بکەن"**..

دوای تۆزێك بێدەنگی لەدەرگا درا خوشکە بچووکەکەم هاتە دەرگای ژوورەوەو گوتی:" لیۆ..ئەوە خۆزێیە.."زۆر دلخۆش بووم لەهاتنی خۆزێ، دیتم خۆزێ لەدەرگای دەرەوە هاتبووە ژوورێو چاوەڕێی من بوو..لەو هاتنە ژوورەی زیاتر هەستم بە شلەژانی خۆزێ کرد، نەمدەزانی بۆ پێی ناخۆش بوو لۆڤانا لای منە، نازانم.!

کە منی لە پەنجەرەکەوە بینی خۆی وەژوورکەوتو منیش بەرەو ژووری دانیشتنی خۆمو لۆڤانام برد، ئەو ژوورەی کە منو خۆزێ بە بەشێك لە تەنیاییەکانی خۆمانمان دەزانی..ئەو ژوورەی پڕبوو لە گریانو پێکەنینەکانی ئێمە، پڕە لە بێ ئومێدیو کتێبو شوشەی بەتالی شەرابی نێو کانتۆرەکە..بەر لەوەی بچمە لای خۆزێ بە لۆڤانام گوتبوو کە ئەمەوێ خۆزێ بێتە ژوورەوە، زۆر گەشاییەوە. خۆشم

مەبەستم بوو پێی ئاسایی بوو. دانیشتین..دنیایەکی مات‌و بێدەنگ، لەوێوە هەستم بەسەرەتایەکی ناخۆش کرد، شڵەژانەکان بەچاوانەوە دیار بوون، شەوێکی گوماناوی دەستیپێکرد، خۆزێم دواند..نیّ بۆ دواکەوتی..خۆزێ "ئا لەو ماڵە بوومو قسەمان زۆر کرد، کەمتر **ڕێگایان دام زووتر بێم**"، باسی زۆر قسەی خۆشیکرد کە لەگەڵ جۆزێفی هاوڕێمان کردبووی، منیش لەبەر ئەو ویستم هەم گوێگربم‌و هەمیش بارە تەنیایی‌و ماتییەکەی ژوورەکەم بڕەوێنمەوە، خۆزێ ناڕەحەتی پێوەدیار بوو. خۆی دەخافڵاند چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون، لۆڤاناش بێدەنگ‌و چاوەکانی هەڵنەدەهێنان..ئا ..بیرم چوو کە سەرەتا خۆزێ هاتە ژوورەوە تەوقەیەکی ساردو سڕی لەگەڵ لۆڤانا کرد، ئەگەرچی زۆرتر قسەی نەکردوو دانیشت، تۆزێکی تر بەپێوە وەستاو دوایی لە زەینەکە کاسێتێکی هەڵگرتوو گوتی: "دەڕۆم..!" گوتم بۆ کوێ؟ ئا ئەبێ بڕۆم..ئێوارە پێی گوتبووم دەمێنمەوە..بێ ئۆقرەیی پێوە دیار بوو..زۆریم لێکرد بمێنێتەوە ..بەقەد دنیا پێمخۆش بوو ئەو شەوە قسە لەگەڵ لۆڤانا بکات..گوێی لێنەگرتم‌و بەرەو دەرگا ڕۆیی، منیش بەدوایدا چووم هەستم کرد خۆزێ بەدڵشکاوی دەڕواو چاوەکانی پڕبوون لە گریان، نەمدەزانی دەبێ گوناهی من چیبێت؟!

زۆر بەساردی خواحافیزی کرد، دوای ڕۆیشتنی خۆزێ هەستم بە وێرانییەکی زۆری خۆمکرد..وەلێ دەنگم نەکرد..تا تۆزێك خۆشم ئارام بوومەوە درەنگتر چوومەوە لای لۆڤانا. ئێوارەکەی خۆزێ پێی

خۆشبوو بێته لامو بەتەنها قسه بکەین...من ڕێگام پێیگرتو گوتم: لۆڤانا لە ژوورەکەی من دەبێتو نەبێ ئێمەش کە بەتەنیا قسە بکەین لەوێ بین..بۆیە پێویستە لەگەڵ لۆڤاناش قسە بکەی.

خۆزێ ڕۆیشت..کە بەرەو ژوور بوومەوە لۆڤانا کە سەرەتا دڵخۆشی پێوەدیار بوو بەهاتنی خۆزێ، ماتو بێ خوستو..پڕوکابوو..ئەو بارە زۆر نیگەرانی کردم، هەستم بە تاوانێك دەکرد، لۆڤانا پرسی: **"خۆزێ بۆ ڕۆیشت؟"** بە ڕۆحێکی زۆر ماندووەوە گوتم: ئیختیاری وابوو، لۆڤانا داماو بوو..دەنگی نەدەکرد، نەمزانی لەبێتاقەتی خۆیو ڕۆیشتنی خۆزێ غەرق بووە. بۆیە چەند جارێك لەسەریەك پێموت: ببوورە کە هاتنو ڕۆیشتنەکانی خۆزێ بێتاقەتیان کردی..منیشیان وێران کرد..بەڵام نازانم بۆ ڕۆیشت..! ببوورە.

-٧-

نەمدەزانی چۆن بێدەنگیو خەمزەدەیی لۆڤانا بڕەوێنمەوە، ژوورەکە چەند بێئومیدو کپە ئەوەندەی تر ببوو بە وێرانە، خۆشم کۆڵێك خەمو ناسۆریم هەبوون، دەمێکە لە ماریانا بێخەبەرم، خۆزێ ئەو بارەی منی نەزانی زۆر جار کە باسی ماندووبوونی خۆم بۆ خۆزێ دەکرد دەیگوت:" **دەزانم تەنیای لەوانەشە تەلەفۆنێك نارامت**

بکاتەوە..جارناجار گاڵتەشی پێدەکردم..دواجار مەجبووربووم دڵی لۆڤانا بدەمەوە.."

لۆڤانا..زۆرجار ئینسانەکانم خۆشویستوون کەسانێك لەو خۆشەویستیەمدا بوون بە بەشێك لەژیانم..زۆریش ماندوو بووم تاوەکو خۆشەویستەکانم نەدۆڕێنم..ئەی تۆ لۆڤانا بۆ دەنگ ناکەی. بێدەنگ دەبوومەوە..ژوورەکە زۆرتەنیایە بۆیە جارناجارێ دەمگوت: ببورە لۆڤانا من هەست بەتاوانێك دەکەم ئەبێ بمبووری..منیش پێم خۆش نەبوو خۆزێ رۆیشت. لۆڤانا دەیگوت:" نا توخودا وامەڵێ..نارحەت نییم..دەمزانی وانییە..نارحەتیەکەی بەرەو وێرانی دەچوو، پڕوکابوو، دڵی پڕببوو، چاوەکانی گریانیان تێنەزا، بەڵام گریانێکی بێدەنگ. لەو کاتەدا خۆزێم زۆر بە نا ئینسان دەهاتە بەرچاوو دڵێشم نەدەهات هیچ قسەیەك بکەم، لۆڤانا ئەوە دەگری؟" نا..لیۆناردۆ..ناگریم.."با دەگری..." تا دواجار لیۆناردۆش خۆی پێنەگیراو..گریا.

" کاتێك لیۆناردۆ گریا، لۆڤانا هەمان ئەو قسەیەی بە خۆزێی گوتبوو بە لیۆنارۆشی گوت: خۆشحاڵم کە کوڕێك لەبەردەمی مندا دەگری".

ئیدی تەنیاییەکانی ئەوو وێرانیەکانی خۆم بەهاوبەش دەزانین.."لیۆناردۆ قەت نەمدەزانی ئەوەندە سۆزت هەیە"، ئەو نەیدەزانی ماریانام خۆشدەوێت..ئای ماریانا..نەمدەویست پێی بڵێم منیش هەست بە تەنیاییەکان دەکەم، تەنیاییەکی چاوەڕێکراو کە

ناکرێ تۆ وەك خۆزێ ناخی من تێبگەیت. بەڵام ئەو جارە من بێدەنگ دەبووم..ئەو دەیگوت: **"توخودا قسە بکە.."**

بەڵام چۆن قسە بکەم؟! بە ناستەم قسەم دەکرد خۆزێ ئەو شەوەی لە هەردووکمان تێکدابوو، بێدەنگی منو گریانو بێدەنگی لۆڤانا بەردەوامە.. لۆڤانا وردە وردە دەستی دەکردە قسەکردنو دەوەستا..باسی کلاودیای هاوڕێی بۆ کردم دەیگوت: "کلاودیای هاوڕێم زۆر خۆشدەویست زۆر پێکەوە بووین ئەو لەرشتەی زماندا دەیخوێند. چەند ساڵێك بوو پێکەوە بووین، نازانم چۆن وەسفی ئەو خۆشەویستیەم بکەم. لەگەڵ کلاودیا ساڵی رابردوو زۆر لێك نزیك بووین..ئەویش دەیزانی خۆزێم خۆشدەوێت، رۆژێکیان هەر بۆ گاڵتە ئەڵقەیەکم لەپەنجە بوو، بە برادەرەکانم گوت: شووم کردووە کەچی کلاودیا گوتی: **"نا..ئەی خۆزێ؟!"** لەناکاوڕا ئەو قسەیەی کردوو..بێدەنگ بوو! زۆر بە پەرۆشەوە ئەو قسەیەی پێگوتم ..زۆر منی خۆشدەویست. نەیدەویست پێ لەخەونەکانم بنێم..کەچی ئەمساڵ برادەرێکی تر کلاودیای دەستەخۆشکی لێسەندوومو بەتەنیا ماومەتەوە نازانم لەگەڵ کێ رەسم بگرم. زۆر بێ هاودەمم".

جارناجاریش چاوەکانی لێك دەناو دەگریا. سەری دەخستەسەر سەرینەکەو خەمزەدەییەکی زۆری پێوەدیار بوو..کە پێم دەوت دەگری..نا..نا..لیۆناردۆ ناگریم. بەردەوام دەبووەوە:" لیۆناردۆ تۆنازانی؟! خۆزێ هاوڕێم بوو، خۆشمدەویست، ئێستا تەنیام ئەویش

لێم ناپرسێت، نازانم بۆ لێم ناپرسێت. تۆ بزانە مـن سـەفەری قاجـارم کرد، یەکەم کەسێك کە هاتمەوەلای خۆزێ بـوو، ئـەو کاتـە گـەڕابووەوە تراونا، دوایی زانیم ئەوڕۆژە تۆش لەوێ بوویت. پێم خـۆش بـوو تـۆش ببینمو خواحافیزیت لێبکەم، بەڵام خۆزێ باسی تۆی نەکرد..نا..لۆڤانا خۆزێ پێیگوتم لۆڤانا هاتبوو. ئەو باسە یەکێك بـوو لـە گومانـەکانی خۆزێ؟ چونکە ئەو شەوە لیۆناردۆ گوتی: خۆزێ نـاکرێ لۆڤانـا بـەمن بڵێت نەمزانیووە تۆ لەماڵی خـۆزێ بوویـتو تـۆش کـە هاتیـە ژووری گوتت لۆڤانا سڵاوت لێدەکات..من چۆن گومانێکم لـە نێـوان گـوتنو نەگوتنداو زانینو نەزانیندا بۆ پەیدا نابێت.

لۆڤانـا:" ئـەوە زیـاتر لەچـوار مـانگ دەبێـت گەڕاومەتـەوە خـۆزێم نەبینیوە. ئەو ڕۆژە سـەیری نامەکـەم ئـەکرد کـە لەگـەڵ دیارییەکـەدا پێچابووم، گوڵێکی تێدایە گوڵەکە وشك ببوو...لیۆنـاردۆ ئـەزانی زۆر هەستم بـە نارحـەتی کـرد کـەبینیم گوڵـەکان وشـك بـوون، نـەمتوانی بیگەیەنـە خـۆزێ..وێـران بـووم ئـەو ئەبوایـە بێتـەلام مـن لەسـەفەر هاتبوومـەوە..ئـای لیۆنـاردۆ..ئـەو ڕۆژە لـەتراونا بـووم..ئاغـای" مارکۆس"م بینی، پێی وتم بە خۆزێ بڵێ ئـەوە بـۆ سـەرێك لەماڵـەوە ناداتەوە، زۆر دڵخۆش بووم بەدیتنی ئاغای مارکۆس تۆ بزانە من کـە دەچمەوە خۆ دەزانم خۆزێ لەماڵ نییەو لە خوێندنە بەڵام زەنگێك هەر لێدەدەم دڵم پێی خۆش دەبێت..هەڵیـدەگرن، بـەر لـەوەی قـسە بکـەن دایدەخەمەوە، چونکە دەزانم خۆزێ هەمیشە لەماڵ نییە".

لۆڤانا:" زۆرجار بەتەنیا بەتەنیشت یادەوەرییەکانم دادەنیشمو دەگریم..ئای کەمن چەند هەست بە ئارامییەکان دەکەم کە خۆزێ دەبینم. تۆش هاورێی ئەویت وەلێ خۆزێ جارێك ناپرسێ..رۆژێك چوومە کۆلێژەکەیان..لۆزام بینی ئەویش هاورێیەکی خۆزێیە..وەکو من لەوانەیە زیاتریش بێت لای خۆزێ. هاورێی تریشی هەیە..".

گومانێکی تری خۆزێ ئەوە بوو کە نەکا من ئەو شەوە بە لۆڤانام گوتبێ لۆزای وەك دۆست خۆشدەوێت! لام سەیر بوو خۆزێ ئەو قسەیە دەکاتو لەدەمی لۆڤانا دەیگێرێتەوە..

سەیر بوو خۆزێ دەیان جار باسی ئەوەی دەکرد کە لۆزاو لۆڤاناو ئالونا گومان لەیەکتر دەکەنو چەندین جار شەریان بووە، خۆی وای دەگوت کەئەوان بە منیان گوتووە.."کەچی ئەو شەوە خۆزێ دەیویست ئەو گومانانە بخاتەسەر شانی لیۆناردۆ"، ئەگەر وای گوتبێت، لیۆناردۆ دلنیا بوو کە شتێکی نوێ نییە لە لایان...چونکە زۆرجار گومانەکانیان لا دەبوونە راستی.

ئا هاورێیەکە ناوی ئالونایە..لۆڤانا وای هەست دەکرد ناینناسم..خۆزێم بینیو تۆزێك لێم تێپەریو دوایی گەرایەوە وتی: "ئا..چۆنی لۆڤانا" چاكو چۆنیمان کرد، من لای قادرمەکان دانیشتبووم لەبەر ئەوەی لەگەل لۆزا بوو منی بیرچوو بوو..منی نەدیت..

لۆڤانا بێدەنگ دەبووەوە..من تەنها گوێم دەگرت..بەڵام زۆریش وێران بووم. چەند جارێك پێم گوت چی دەکرێ من لەگەڵ خۆزێدا بیکەم..لۆڤانا:" نا..ناتوخودا..لیۆناردۆ". هەستم دەکرد پێی باشە، بەڵام جارێکیان خۆزێ پێی گوتبووم نابێ چیتر قسە لەو پەیوەندییە بکەی. بۆیە لە قسەکانم دوو دڵ بووم. دواجار بێدەنگ بوو..بەدەنگ دەهاتەوەو دەیگوت: زۆرجار جوانو سۆزداریت دەخەیتە بەردەم کەسانێك کە تێیناگەن. پێم ناخۆش بوو ئەو قسانە بە خۆزێ بڵێ وەلێ خۆزێ زۆر دڵ رەق بوو. شەو وردە وردە رادەکشا..نەمدەزانی لۆڤانا ئەو شەوە خەوی نایەت..خۆشم ماندوو بووم. بەرەو رووی دانیشتبووم پیرۆزییەکانی ئەوم لە قسەکانی خۆزێدا دەدی..دەستی دەکردەوە قسەکردن..لیۆناردۆ جارێکیان بە خۆزێم گوت:" بۆ پێم ناڵێیت خۆشمدەوێیت..هیچ دەنگی نەکرد.." لۆڤانا لە قسەکانی دەپچڕا..زۆر لە قسەکانی تەواو نەدەکردن..گریان قوڕگی گرتبوو، ئەگەرچی من هەموو قسەکانم دەزانین. خۆزێ سەروبەری قسەکانی بۆ گێڕابوومەوە..کەچی ئەو شەوە رێگام بەخۆم نەدا ئەم باسە زیاتر قوڵبێتەوە..چونکە خۆزێم لەرۆحەوە خۆشدەویستو لۆڤاناش هاورێم بوو.

لۆڤانا دەیگوت: "یەکەم جار کەماڵمان لە قاجار گەڕایەوە تراوناو لەخوێندن وەرگیرابووم کەسم لەتراونا نەدەناسی تاوەکو سەرو پرسیاری ئەو کۆلیژەی لێبکەم کە لێی وەرگیراو، تەنیا پێیان گوتبووم

خـۆزێ مـاركۆس‌و مـاركۆ ژاكـاريۆ لـەو رشـتەيە دەخـوێنن، بۆيـە بەدواياندا گەڕام..ماركۆو خۆزێ زۆرجار لەبەردەم كتێبخانەی براكەی پـاولۆ دادەنيـشتن..بۆيـە رۆژێكيـان چـوومە بـەردەم كتێبخانەكـەو سەروپرسياری ئەوانم كرد، ئەو رۆژە لەوێ نەبوون، براكەی پاولۆ ژمرەی تەلەفۆنی هەردووكيانی پێدام، من يەكەم جار زەنگی تەلەفۆنی ماڵی ماركۆم لێدا بەڵام لەوێ نەبوو، بۆيە دواجار زەنگی ماڵی خۆزێم لێداو دوای ئەوە بووين بەهاوڕێ...ئەوە بوو ئا..ليۆنـاردۆ. مـن يەكـەمجار ژمرەی تەلەفۆنی ماركۆم لێدابوو، وەلێ كە ژمرەكان هەڵەيان كرد منيش بەهۆيەوە بووم بە هاوڕێی خۆزێ" ..بێدەنگ دەبووەوە..منـيش هـەر هيچ قسەيەكەم نەدەكرد.

جارناجار باسـەكەم دەگـۆڕی..ئـێ لۆڤانـا لەگـەڵ شـيعر خوێندنـەوەدا چـۆنی؟ زەردەخەنەيـەك دەيگـرت، دەيزانـی مـن خـۆم لەباسـەكەی لادەدەم. لۆڤانا ديسان قسەی دەكردەوە.."لەوانەشە خۆزێ كەسێكی تری خۆش بووێت، چـونكە ئێمـە تـەنيا هـاوڕێين، خـەتای خۆشـە"، لێـرەوە ليۆنـاردۆ دەيزانـی كـە هـەموويان خۆزێيـان خۆشـدەوێت‌و هەمووشيان گومانيان لێی هـەبوو، سـەيرە چـۆن خۆشەويـستی لـەنێو گومانـدا دەكرێـت؟ بێـدەنگ دەبـوو..تـاوەكو كـات بـووە نيـوەی شەو..لۆڤانا شەوێكی وێرانمان بوو، نا شـەوێكی خـۆش بـوو..زۆرمـان باس لەتەنيايی ئينسانەكان‌و خۆمان كرد..نەزانم نا مورتـاحی..بـەڵام لۆڤانا ئەبێ بخەوم.

"لۆڤانا لە ژوورەکەی لیۆناردۆ خەوتو ..لیۆناردۆش لە ژووره ساردو گەورەکەی ئەو دیو، کە پڕبوو لە یادەوەرییەکانی لەگەڵ ماریانا..بۆیەش هەردەم لیۆناردۆ کە ماریانا لەوێ نەدەبوو لە ژووره بچووکەکەی دەخەوت..کە ئەو شەوە لۆڤانا لێی خەوتبوو.." شەوباش لۆڤانا ..شەوباش لیۆناردۆ.

-٨-

بەیانی لۆڤانام بە ماشێنێك بردەوە بەردەرگای ماڵەوەیان کە لەگەڕەکێکی تری شاری سیتمۆر بوو. بەرەو رۆژنامە کۆمۆنیستیەکە گەڕامەوە، هەمان رۆژ کە پشووی خۆزێ بوو، تەلەفۆنم بۆ کردوگوتم: نیوەڕۆ دێمە لات..چی دەڵێیت پێی خۆش بوو، کەچووم..ئەو رۆژە میلۆناش لەوێ بوو میلۆنای هاوڕێمان سۆزانای کچە جوانی تراونای خۆشدەویست، پاش ماوەیەك لەخۆشەویستیان سۆزانا لە میلۆنا زویر ببوو، دواتر شووی کردو، کاتێکی ناخۆش‌و زەمەنێکی پڕ غەدرو گوناهی بۆ میلۆنا جێهێشت. بۆیە میلۆنا زۆرجار دەیگوت سۆزم داوە کە خۆشەویستیەکی ئەفلاتونیانە بژیم، دوایی میلۆنا رۆیشت‌و تەنها من‌و خۆزێماینەوە..زۆر وێران بووم، وێرانیەکانی شەوی رابردووم بەتەوێڵەوە دیاربوو..میلۆنا پێش رۆیشتنی چەند قسەیەکی کرد، بەڵام لەبەر بێ تاقەتی خۆم وتم: لەکاتی خۆی وەڵامت دەدەمەوە.
خۆزێ پرسی ئەم شەو چی بوو؟!!

لیۆناردۆ: زۆر دانیشتین لەگەڵ لۆڤانا..باسی زۆر شتمان کرد. خۆزی گوتی:" **باسی منیشتان کرد؟!** نەمویست بڵێم نا..بەڵام بەر لەوەی پێی بڵێم..ئا چەند ساتێکیش باسی تۆمان کرد. گلەیی ئەوەم لێی کرد کە رۆیشت..بەهەرحاڵ..هەستم کرد زۆر پێی ناخۆش بوو لەگەڵ لۆڤانا باسی ئەوم کردوە. بێدەنگ بووم جگەرەیەکم داگیرساند..ئەویش بێدەنگ، نەم دەویست قسە بکەم..بۆیە دوای نانخواردن کاتژمێر سێی نیوەڕۆی رۆژی دواییمان دانا یەکتر ببینین. لە وادەی خۆی خۆزی هاتە رۆژنامە کۆمۆنیستیەکەو لەوێ بەرەو ماڵ بووینەوە، شەو لەماڵی ئێمەو لەتەنیشت کڵێسەکەی مەریەمدا بەیەکەوە بووینو زۆر قسەمان کرد کات درەنگ بوو، مەبەستم بوو قسە لەو شەوە بکەم، چونکە هەستم بەوە دەکرد نەوەکا خۆزێ هیچ گومانێکی لەمن هەبێت؟!! نەمتوانی بەروونی قسە بکەم بەلاّم لە قسەکانی دیاربوو سەرەتا بێدەنگ لە بەرامبەر قسەکانی من راکشاوو منیش زۆر لەو بێدەنگیە بێزار بوومو راکشام..

دوایی خۆزێ هەڵسایەوەو وەڵامی دامەوە: دیسان باسی ئەوەی کرد کە کاتی خۆی چی بە پاولۆو میلۆنا گوتووە. پێم ناخۆش بوو کە بۆ یەکەمجار خۆزی منو هاوڕێکانی تری وەك یەك حساب دەکات.

وتی: ئەمڕۆ لۆڤانام لە کۆلێژی زمان بینی، قسەمان کرد پێمگوت: نابێ بەهیچ شێوەیەك مەسەلەی من لەگەڵ لیۆناردۆو هاوڕێکانی ترم باس بکەی.. وادیارە خۆزێ چووبووە لای لۆڤاناو نیگەرانییەکانی

وایان لێکردوه خۆی بۆ نەگێراوە تا ئەو کاتەی من قسەکانی بەتەواوی بـۆ بـاس دەکـەم. ئـەو شـەوە لیۆنـاردۆ زۆر دڵـی شـکاو قـسەی نەکرد..قسەکانی خۆزی تورەییان پێوە دیار بوو.

لیۆنـاردۆ بـەخۆزێی گـوت: "**خـۆزێ مـن تـۆم خۆشـدەوێت، لۆڤانـاو هەموو هاوڕێکانی ترم لەرێگای تۆوە ناسین..زۆرچاك دەکرێ من باس لە هـیچ مەسـەلەیەك نەکـەمو ئەگـەر دەشـتەوێ واز لەهاوڕێیـەتیان دەهێنم**"..

خۆزێ: "**نامەوێ سەری خۆت بەهەندێ مەسەلە بێشێنی، هاوڕێیەتی کردنی ئەوانیش پەیوەندی بەمنەوە نییە**".

زۆر نیگەران بووم، هەستم بە رووشانی ناخم کـرد تێبینـی قـسەکانی خۆزێم کردبوو، هەندێ مەسەلەی کە پێشتر خۆزی بـۆی باسـکردبوومو خۆشم کەم تازۆر ناگام لێیبوو، دەمبینی خـۆزی ئـەو شـەوە قـسەکانم بەشێوەیەکی دیکە بۆ باس دەکات، دەیویست شتەکانم لێ بشارێتەوە! بەگومانیش بووم لەو بۆچوونەی خۆم؟!! بەڵام...

ئینسان پەیوەندییە روحیەکانی لە شوشەن، تەنكو هەمووشیان جوانی خۆیان هەیە..من خـۆزێم لەهـەموو برادەرەکـانی تـر خۆشتردەویـست، بۆیـە دەنگـم نـەکرد هـەقی ئەویـشی تیـا بـوو، چـونکە زۆری پـێ گوتبووم..نابێ قسە لەمەسەلەی منو لۆڤانا بکەی..ئـەو شـەوە دوای ئەوەی قسەی هاوڕێیـەتی خۆمانمـان کـرد هـیچ گومانێکمـان لەیـەکتر نەبوو. کردمانە گاڵتەو تۆزێك پێکەنینو پێکەکانمان هەڵدانو بـەیانی

زوو ئەو چووە خوێندنو منیش بەرەو رۆژنامەکە بوومەوە. بۆیە خۆزیم خۆشدەویست چونکە راستی دەوتو کە ماریاناش لەوێ نەبوو زۆر دڵنەوایی دەکردم..

**"ئەو ئیمانی بەهاورێیەتی خۆیو لیۆناردۆ هەبوو، خۆزی کە هاورێی منداڵی لیۆناردۆ بوو پەیوەندییەکی روحیان لەنێواندا هەبوو، خۆزی دەیزانی لیۆناردۆ ماریانای خۆشدەوێت، لیۆناردۆش دڵنیابوو کەخۆزی ئەوی خۆشدەوێت"..**

لیۆناردۆ دەیگوت: هەر ناارامیەکی نێوان هاورێ خۆشەویستەکان چەند گریانیشیان بەدواوە بێت، بەڵام روودانیان بەشێك لەجوانیو بەشێك لە ناشیرینیو بەشێك لە خۆشەویستیو بەشێك لەرۆحو لە یەکجەستەیان دەبەنو بەشێك لە نائینسانیەتەکانو بەشێك لەژیانمان لە زەمەنمانو بەشێك لەرابردوومان وێران دەکەنو ئایندەشمان دەخەنە بەردەم رووشانو ئەوەی بڵێین ئەو درزانە پێویستیان بە زیاتر خۆشەویستی هەیە. ئەگەرنا کە گومانەکان گەورەبوونو خوشەویستی پێیان رانەگەیشت، ئەوا بەرەو یەقین دەچن. پەیوەندییە روحیەکانی ئینسان لە شووشەنو هەریەکەیان حەقیقەتێکی خۆی هەیەو حەقیقەتی رەهاش لەلای هیچ کەسێکمان نییە..لیۆناردۆ لەگەڵ ئەمەش لەلای هاورێکانی تری دەیگوت ئێستاش خۆزێم هەر خۆشدەوێت..خۆزێش ئەو نۆڤلێتەی بەر لەبڵاوبوونەوەو لە ساڵی ۱۹۰۰و لەشەوێکی پاییزیدا لە کاتی خەوتنی لیۆناردۆدا خوێندبوەوە.

# کتێبەکانم:

## کتێبی نووسین:

١- **مۆمیای عەرشی سپێدەیەك** / شیعر/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما ٢٠٠٠.

٢- **دیموکراسیەت جیاوازی و پێکەوەژیان** / نووسین/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما،ساڵی٢٠٠٢.

٣- **دەربارەی عەلمانیەت** /نوسین/ بەهاوبەشی " ئیسماعیل کوردە ، بەختیار عەلی ، شاهۆ سەعید، هەڵکەوت عەبدوڵلا، جەمال حسێن، توانا ئەحمەد" / لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما،ساڵی ٢٠٠٢.

٤- **عەلمانیەتی ئەوان و نیگەرانی ئێمە**/ نوسین/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما /٢٠٠٥.

٥- **وێنەکانی لەبەر باران ونکردووە/ شیعر**/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما٢٠١٠.

٦- **لەناو گێژاوی سیاسەتدا/مێزگەردو گفتوگۆ**/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما ٢٠١٠

٧- **١٩٠٠ تێپەڕیوە/ نوڤلێت**/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما ٢٠١٠.

## کتێبی وەرگێردراو:

٨- **چەپ، دیموکراتیەت، خۆبەئیسلامکردووەکان**/ نووسینی: د. رەفعەت ئەلسەعید/ لەعەرەبیەوە وئیسماعیل کوردە/٢٠٠٠/.

٩-**گیروگازی چەمکی کۆمەڵی مەدەنی**/ نوسینی : د. کەریم ئەبو حەلاوە/ بەهاوبەشی لەعەرەبیەوە/ "و: ئیسماعیل کوردە، رەوشت رەشید، نووری بیخاڵی"/چاپی یەکەمی لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما،ساڵی ٢٠٠٣/ چاپی دووەمی لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری ئما ٢٠٠٤.

١٠- **مارتن هایدگەر**/کۆمەڵێك نووسەر/ و: ئیسماعل کوردە/ چاپی یەکەمی لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری غا ٢٠٠٣/ چاپی دووەمی لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس٢٠٠٨/.

١١-**قوتابخانەی فرانکفۆرت، لەروانگەیەکی مارکسیەوە**/ نووسنی: فیل سلیتەر/ بەهاوبەشی لەعەرەبیەوە " و: ئیسماعیل کوردە، رێبین رەسوڵ ئیسماعیل، نووری بێخاڵی"/پێداچوونەوەی نورەددین سەعید وەیسی/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری غا ٢٠٠٣/.

١٢-**قوتابخانەی فرانکفۆرت لەهۆرکهایمەرەوە تا هابرماس**/ نوسنی: د. عەلا تاهیر/ بەهاوبەشی لەعەرەبیەوە/ و: ئیسماعیل کوردە، جەمال پیرە/ لەبڵاوکراوەکانی سەنتەری غا ٢٠٠٥/.

١٣- **کۆتایی مێژوو، دوایین مرۆڤ**/ نوسینی : فرانسیس فۆکۆیاما/ لەعەرەبیەوە" و: ئیسماعیل کوردە" پیداچوونەوەی"رێبین رەسول ئیسماعیل" لەبڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێران/ سلێمانی٢٠٠٨.

١٤- **سەرمایەداری یان دیموکراتی؟** /نوسینی مارك فۆربایبە/ و: ئیسماعیل کوردە/ پێداچوونەوەی " رێبین رەسوڵ ئیسماعیل. لەبڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێران/ سلێمانی٢٠٠٨.

١٥- **بونیادنانی دەوڵەت/فرانسیس فۆکۆیاما/و:ئیسماعیل کوردە/** لەبڵاوکراوەکانی خانەی وەرگێران/ سلێمانی٢٠٠٩.